# محمد

صلى الله عليه وسلم

# خۆشم دەوێت

حاجی کاروان





۞ ناوی نامیلکە : (محمد ﷺ) خۆشم دەوێیت..

۞ نامادەکردنی: حاجی کاروان

۞ پێداچوونەوە: صهیب جمیل علی

۞ تایپ: هۆگر خدر نانەکەلی

۞ چاپ و دیزاین : ناوەندی راگەیاندنی نارا

۞ ژمارەی سپاردنی (٤٤١)ی ساڵی (٢٠٠٧)ی دراوەتێ

www.bextewery.com
info@bextewery.com



# خۆشم دەوێیت..

دوای ١٤٣٥ ساڵ لە هاتنی گەورەترین بەخششی خوایی بۆ مرۆڤایەتی، شوێنکەوتوانی موحەممەد (ﷺ) لە زیادبوون و لە گەشەسەندندان و سوپاس بۆ خوا ساڵ بەساڵ و رۆژ دوای رۆژ خۆشەویستی لە دڵەکان زیاتر دەبێت، گومانی تێدا نیە کە پیرۆزترین سەرمەشقی کاروان و سەرکەوتوترین مرۆڤ پێغەمبەری خودایە، کەواتە پێغەمبەرێك لە لایەن خواوە بۆ من هاتبێ چۆن پێشوازی لێنەکەم؟ هەروەها تاچەند رێزی لێ دەگرم و چەندێکیش دڵی خۆمی پێدەدەم و دەبێ چەندێکیش تامەزرۆی دیداری ئەو پێغەمبەرە خۆشەویست و بەرێزە بم (ﷺ) ؟ پرسیار لەخۆم دەکەم چەندێ خۆم بە خەمخۆری رێبازەکەی ئەو خۆشەویست و ئازیزە زانیوە؟ چەندم لە ژیان و لە پارە و لە کات و لە ماندوو بوون و لە

شەونخونیم بۆ ڕێبازەکەی تەرخان کردووە و ئەزیەتم بۆی کێشاوە؟ .. منی هەڵگری پەیامەکەی موحەممەد(ﷺ) ، منی موسڵمان، چیم لەسەرە بۆ سەرخستنی ئەم پەیامە شیرین وخۆشەویستە ؟ گەر من هاوەڵێکی ئەو بم چ کوڕ بم یاخود کچ، چۆن لەبەردەستی ئەوخۆشەویستە خزمەتی خۆی و ئاینەکەم دەکرد؟ چەندێك لە ئازاری ئەو پێغەمبەرەم کەم دەکردەوە و چەندیش خۆم دەکرد بە فیدای و چەندیش خۆم بە قوربانی دەکرد؟ ئاخۆ مەقام و پلە و پایەی من و تۆ چەند دەبوو لە لای ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە و چەندێکیش خۆشمانی دەویست؟ ئەو پێغەمبەرە ئازیزەش چەندە دڵی بەئێمە خۆش دەبوو؟ چەندیش لێمان رازی دەبوو؟ گەر پێغەمبەری خوا(ﷺ) دایك و باوکی فیدای هاوەڵانی کردبێ وەکو (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس) ئاخۆ چی بە ئێمە دەگوت؟ تۆی بەندەش گەر دەتەوێت پلە و پایەی خۆت لە لای پێغەمبەرەکەت بزانی ئەوە بپرسە ئاخۆ پلە و پایەی پێغەمبەر لەلای تۆ چەندە؟ لەم ڕۆژگاری زاڵ بوونی خۆشەویستی دنیا و کەس و کار و بازرگانی و ماڵ و منداڵ و پارەیەدا بەسەر دڵ و دەروونی مرۆڤ، چۆن وا بکەین

خۆشەویستی پێغەمبەری خوا بکەینە (قەڵغانێك) یاخود (شورەیەك)ی پۆلایین بۆ پاراستنمان لە دنیا پەرستی و تەمەن بە فیڕۆچوون و بە هەدەر چوونی سەرمایەی ژیانمان؟

خوای گەورە پرسیارمان لێ دەکات و بەراوردمان بۆ دەکات لە نێوان ( خۆی و پێغەمبەرەکەی و کۆشش و جیهاد کردن و خۆشویستنی دنیا و کەس و کار و پارە و ماڵ، وەك دەفەرموێت:

﴿قُلْ إِن كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ اللّهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُواْ حَتَّى يَأْتِيَ اللّهُ بِأَمْرِهِ وَاللّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ﴾ التوبة:٢٤

ئاخۆ کێ پلەی خۆشەویستی لای تۆ زیاترە؟ کێ لە پلەبەندی یەکەمی خۆشەویستیە لای تۆ؟ ببینن ریزبەندی یەکەمی ئایەتەکە:

یەکەم : بە (اباؤکم) دەست پێ دەکات .. کە باوك و دایکن و نزیکترین کەسن و، زۆرترین چاکەیان هەیە و، دلسۆزترین کەسن و بەبەزەیی و خەمخۆرترین کەسن بۆ

منداڵەکانیان، بۆیە دەبێت خۆشمان بوێن، لەبەر ئەم هۆیانە و لەبەر ئەوەی ئەوان لە هەموو کەس زیاتر ئێمەیان خۆشتر دەوێت و مافیان بەسەرمانەوەیە.

دووەم: (أبناؤکم) کێ هەیە نکۆڵی لە خۆشەویستی جەرگی خۆی بکات، کێ بە هێندەی منداڵ خۆشەویستە لای دایک و باوک؟ بە ئازاریان بە ئازارین، بە خۆشیان دڵ خۆشین، شەونخونی و کاسبی و ئیش و کارمان تەنها بۆ منداڵە، تەماشابکەن کاتێک منالێک دەمرێت دایک و باوک چیان بەسەردێت، چۆن ژیانیان دەگۆرێت ڕەنگ زەرد و لێو بە بارن و جلی رەش دەپۆشن و غەم بەسەریان دادەبارێت.

سێیەم: (إخوانکم) خوشک و برایەتی، کێ هەیە برا و خوشکی لا خۆشەویست نەبێ؟ چ خوشکێ دڵی لای برای نییە؟ کاتێ نەیبینێت یاخود لەگەشتدا بێ، یاخود نەخۆش بکەوێت، چ برایەک دڵی لای خوشکی نییە و، سەربەرزە بەوان و خۆی بەشەرەفدار دەزانێ بۆیان، سەیرکەن کاتێک کەسێکی دلسۆز برایەکی کارەساتێك رووی تێدەکات خوشکەکەی ئامادەیە خۆی بدات بە کوشت لەسەری.

چوارەم: (أزواجكم) هاوسەر، ئەم پرسیارە گەر لە خۆمانی بکەین چەندێ خێزان و هاوسەرم خۆش دەوێت؟ لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەپرسن کێ خۆشەویسترین کەسە لای تۆ؟ دەفەرمووێت: عائیشە.... خوای کردگار خۆشەویستی لە نێوان ژن و مێرد دروست دەکات ﴿وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً﴾، تەماشا بکەن چەندەها کچ لە پێناو خۆشەویستەکەی ژیان و شەرەف و خێزان و ئاینەدەی خۆی دەخاتە مەترسیەوە، بگرە بەسەدەها کەس هەبوون یان هەن خۆیان کردووە بە قوربانی (عاشقەکەی)، بگرە ئامادەیە خوا و پێغەمبەر و دایك و باوك بڕەنجێنێ لە پێناو کەسێ کە خۆشی دەوێت!!! بیهێنە بەر دیدەو چاوەکانتان کام دڵدار دڵی دێت دڵی دڵدارەکەی بشکێنێ و تورەی بکات؟ بۆ ناتوانێت؟ چونکە خۆشەویستییەکەی ڕێگەی پێ نادات، ئەی بۆ دڵم دێت خوای گەورە بڕەنجێنم؟ پێغەمبەرەکەم ڕووشکێن بکەم؟ چونکە خۆشیانم ناوێت .... ؟

ئەمجارە دەرەوەی خێزان:

پێنجەم: (عشيرتكم)، هۆز، واتە کۆمەڵە کەسێ کۆیانی کردۆتەوە ڕەچەڵەك بێ، یان بیر و بەرنامەبێ، یاخود نەتەوە

بێ، یان.......هتد، لەم رۆژگارەی ئەمڕۆماندا موسڵمان شایەتمان بە پێغەمبەر(ﷺ) دەهێنێت بەڵام سەرکردەکەی خۆی، یاخود سەرۆکەکەی خۆی لەلاخۆشەویستترە، یاخود لە پێناو مانەوەی خۆی بە عەشیرەت و هۆز و حزبەوە، ئامادەیە پەیڕەوی بەرنامەی خوانەکات یاخود تەنانەت ئامادەنییە بە خوا و پێغەمبەر(ﷺ) بیانگۆڕێتەوە ..!!

نموونەیەك: چەند سەردەستە و باوك سالاری و عەشیرەت گەری وای کردووە کچان شوو نەکەن بە کوڕانی باش و باوەڕدار، تەنها بەهۆی ئەوەی کەئەو گەنجە لەو عەشیرەتە نیە یاخود لە بنەماڵەکەی ئەودا نیە، ئاخۆ پێوەری من لەسەر بنەمای (خۆشەویستی خواو پێغەمبەر) لە (خۆشەویستی ئەوانە).

ئەوەندی باسکرا پەیوەندی بە خودی مرۆڤەکان هەیە لەگەڵ یەکتردا، ئێمە وەکو مرۆڤ پەیوەندی راستەوخۆمان هەیە لەگەڵ ئەم پێنج کەسەدا، بێگومان دەبێ بۆ پتەوکردنی پەیوەندییەکان خۆشەویستی هەوێن بێت، بگرە ئەم پەیوەندیانە گەر خۆشەویستی تێدانەبێ نیشانەی (کاڵ بوونی باوەڕە)، کەواتە پرسیارەکەی خوا و پێغەمبەری

خۆشەویست لە ئێمە، ئەوەیە ئەم پێنج کەسە خۆشەویستە لەلای تۆ شایستەبن خۆشیانت بوێت، کە هەموویان خەڵاتی خوایین، ئاخۆ جگە لە خوا و پێغەمبەری خودا(ﷺ) لای تۆ کەسێکی خۆشەویستتر هەیە؟ فەرموودەیەك هەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) باسی کاتێك دەکات کە خەڵکی پێوەرەکانیان دەگۆڕێت دەفەرموێت:(یحبون الخلق و ینسون الخالق)، دروستکراوەنیان خۆش دەوێت و خالقی خۆیان بیر دەچێتەوە، ئایا باوك و دایك و برا و خوشك و خێزان و عەشیرەت هەمووی بەخشینی خوانین؟ کەواتە دەبێ خوای گەورەم لەوان خۆشتر بوێت، وە بۆ ئەوەی خودام خۆشبوێت دەبێ پێغەمبەرەکەیشم خۆش بوێت، لەلایەکی ترەوە ئەم (پێنجە) جاری وا هەیە بەرامبەر یەکتر خراپن بەلام پێغەمبەری خوا هیچی بۆ ئێمە خراپ نیە، ئەم (پێنجە) تاماوەیەك لە گەڵ تۆدا دەبن، بەلام پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەناو گۆڕ و لەمەحشەر و لەسەرپردی سیرات و بگرە گەر ئەهلی دۆزەخیش بیت فریات دەکەوێت و شەفاعەتت بۆ دەکات!!!

پێغەمبــەری خۆشەویســت ئــەم دیمەنانــەمان بــۆ دەگێڕێتەوە:-

دەفەرموێت (لە ڕۆژی حەشردا پێغەمبـەران کورسیان بۆ ڕیزکراوە لـە شـوێنی بـەرز لـە سـەر سـەکۆی (نـور)و هـەموو پێغەمبـەران لەسـەر کورسـی خۆیـانن، تـەنها مـن نـەبێت دانەنیشتووم لە ترسی ئەوەی نەوەك خودا بمباتە بەهەشت و ئوممەتەکەم بمێننەوە و لە بەهەشت بێ بەش بن و لـەیادیان بکەم)!.

تەماشای ئەم دیمەنە بکە (٢٤) هەزار کورسی پڕاو پڕ لـە نور و درەوشاوە هەیە و هەریەکـە و پێغەمبـەرێکی لەسـەرە، تەنها (محمد المصطفى) نەبێت خەمی من و تۆیەتی!!.

دیمەنێکی تر: پێغەمبـەری خۆشەویسـت(ﷺ)دەفـەرموێت: لە ڕۆژی مەحشـەردا کەسـێ دەهێـنن لەبـەردەم پـەروەردگار دادگایی دەکرێت، بۆچوونە بەهەشت یەك چاکەی پێویستـە، چـونکە چـاکە و خراپـەی یەکسـانە خـوای گـەورە مۆڵـەتی دەدات بگـەڕێ بــە دوای کەسـێکی نزیکـی خـۆی بــەڵکو چاکەیەکی پـێ بـدات!!! دایـك و بـاوکی دەبینـێ دەڵێـت پێویسـتیم بـە یـەك چـاکە هەیـە و پـێم ببەخشـن، ئـەوانیش

ترسناکی ئەو رۆژە و نادیاری ئایندە و گرمە و ناڵەی دۆزەخ و هاوار و قیژە و فیغانی دۆزەخیان بیستووە دەڵێن ناتوانین، ﴿يَوْمَ يَفِرُّ الْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ * وَأُمِّهِ وَأَبِيهِ * وَصَاحِبَتِهِ وَبَنِيهِ * لِكُلِّ امْرِئٍ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ﴾ دوایی دەگات بە هاوسەرەکەی و دەڵێ : من و تۆ خۆشەویستی یەك بووین لەدنیادا یەك چاکەم بدەرێ، ئەویش هەمان وەڵامی پێیە کە (نایدەم)، دەگەڕێتەوە لای پەروەردگار و دەڵێ : خوایە کەس پێ ی نەدام و هیچم دەست نەکەوت، لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمان لە خوای میهرەبان وەردەگرێت تاوەکو شەفاعەتی بۆ بکات، پاشان خوای گەورە بەر شەفاعەتی دەخات ودەیخاتە بەر رەحمەتی پڕ میهری خۆی ودەیخاتەبەهەشتی پان و بەرین و نەبڕاوە))!!!.

لە دونیاش جاری وا هەیە کەس فریات ناکەوێت ئیتر چۆن ئەو پێغەمبەرەم خۆش نەوێت لە هەموو کەس زیاتر؟ کەسێ من فێری خۆشەویستی بکات، من فێری خواناسی بکات، کەسێ خوێنی بۆم رشتبێ، ئاهی بۆم هەڵکێشابێ، بۆم گریابێ، نزای بۆکردبم، بە رەحمەت بۆمن هاتبێ، رەوشتم بەرز و بەرێز بکات، کەسێ لە قیامەت شەفیعم بێ، بە بێ من

نەچێتە بەهەشتەوە، کەسێ خۆشەویسترین کەسی خوا بێت، ئاخۆ لە هەموو کەس خۆشترم ناوێت؟ چۆن خۆشم نەوێت و چۆنیش خۆم نەکەم بە قوربانی؟.

کەواتە خۆشەویستی من بۆ پێغەمبەرەکەم، بە مامەڵەکردنم لەگەڵ باوك و دایك و براو خوشك و هاوسەر و عەشیرەت، بەپێ ی ویستی ئەو بێت، گەر هەریەك لەمانە بوونە مایەی دوورخستنەوەت لە خۆشەویستی خوا و پێغەمبەر(ﷺ) ئەوە دیارە ئەوانم لە خوا و پێغەمبەر خۆشتر دەوێت، گەر من خۆ بە قوربان کردن و خزمەت کردن و ماندوو بوونم بۆ ئەم پێغەمبەرە بێت، ئاخۆ چەندم بۆ خوا و پێغەمبەر کردووە، ئامادەم خۆم بکەم بە قوربانی خوا و پێغەمبەر؟ ئامادەم بۆ نوێژی بەیانیان لە مزگەوت بم؟ ئاخۆ کاتێ هاوسەرەکەت پێ ی خۆشە (جلێك) بکەیتە بەرت کردووتە و دڵیت خۆش کردووە؟ ئاخۆ لە خەمی ئەوەدا بویت کە دڵی پێغەمبەری خوا بە جلەکەت خۆش بکەیت؟ وەکو ئەوە وایە پێغەمبەری خوا پێمان بڵێت:

گەر منتان خۆش دەوێت دڵی دایك و باوکتان مەشکێنن؟ گەر منتان خۆش دەوێت ڕقتان لە یەکتر نەبێت؟ گەر منتان

خۆش دەوێت لەگەڵ یەکتریدا پتەو بن و یەکترتان خۆش بوێت، مافی یەکتر مەخۆن؟ گەر پێغەمبەری خوات(ﷺ) خۆشت دەوێت ئەو شتە بکە کە ئەو دەیەوێت، گەر منتان خۆش دەوێت هاوسەرەکانی خۆتان خۆش بوێت و زوڵم وستەمیان لێ مەکەن و مافیان پشتگوێ مەخەن و بەردەوام رێزیان بگرن و هاریکارییان بکەن!!!.

لەبیرت نەچێت دوا وشەی ئەو رۆژی بەر لە دنیا دەرچوونی حەزرەت فەرمووی: (خۆزگە براو خوشکانی خۆم دەبینی) کە مەبەستی ئێمەیە، باتۆش دوا وشەت (اشهد ان لااله الا الله وأشهد أن محمد رسول الله) بێت.

زۆربەی هەرە زۆرمان کەوتووینەتە دوای ماددەوکۆکردنەوەی ماڵ وسامان و پارە وزێڕ، کەخۆشەویستی (ماددە)ش، هۆکارێکە بیر لە خۆشەویستی خوا نەکەینەوە، یاخود هەر غەممان نیە بۆ ئەو خۆشەویستیە راستەقینەیە !!! لە دوای ئەم پێنجە لە دەرەوەی پەیوەندی مرۆڤەکان، مامەڵەی مرۆڤ دێت لەگەڵ (ماددە و پارە وسامان و ماڵی دنیا) کە بە داخەوە جێ ی خۆشەویستی پێغەمبەری گرتۆتەوە، بگرە لە پێش خودا و

پێغەمبەرەوەیە، هەر لەبەر ئەمەش موسڵمانان یاخود وڵاتانی ئیسلامیی پێشکەوتن و سەرکەوتن و عیززەت بەخۆیانەوە نابینن.

(وأموال إقترفتموها) ئەو ماڵ و سامانەی کە بەدەستی دەهێنن یان بە دەستمان هێناوە خۆشەویستربوو لەلاتان، واتە لە خوا و پێغەمبەر و ئاینەکەی، ئەوا چاوەڕوان بن کە چیتان بەسەردێت؟.

لێرەدا ئەمەوێ خاڵی گرنگ بێنمەوە یادتان: بۆ پارە کۆ دەکەیتەوە و لە سەر چی و لە پێناو کێ؟ بۆ چەندێك کۆی دەکەیتەوە؟ چۆن پەیدات کردووە؟ لەچی خەرجی دەکەی؟ ئەو ماڵەی کە هەمە خۆشەویستە لەلام یان پێغەمبەری خوا؟ ڕازیت بەوەی کە فاکسێك یان نامەیەك بنووسیت بۆ پێغەمبەرەکەت ئاگاداری ماڵ و سامانەکەت بێ ئاخۆ چەندت هەیە؟ یاخود ماڵ و سامان دەبن بە گەواهیدەر لەسەرت، یان لەدژت دەوەستن؟ بەڵام پێغەمبەری خوا(ﷺ) شەفاعەتت بۆ دەکات و بەرگریت لێ دەکات، گەر پێغەمبەرت لە ماڵەکەت خۆشتر بوێت، چەندێکت لەو سەروەتە لە پێناو ئاین و چاککردن وهۆشیارکردنەوەی خەڵك و بڵاوکردنەوەی

رەوشتەکانی سەرف کردوە؟ بانگخوازێك وتی پیاوێکی دەوڵەمەندم بینی وتم بەنیازم چەند بڵاوکراوەیەك وەکو (پەرتوك و CD و بابەت) لەسەر خۆشەویست و گەورەیی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) بڵاوبکەمەوە بەڵکو سوود و کەڵکێکی بۆ خوێنەر و گوێگر و بینەر هەبێت، پێت خۆشە هاوکاریمان بکەی؟ زۆربەداخەوە وتی : ناتوانم !!!.

بەیەکێکی ترم وت: کە خاوەنی گەورەترین کۆمپانیایە ولەهەمان کاتیش خاوەنی زیاتر لە سێ ملیۆن دۆلارە جگە لە پارچە زەوی و دەیان شتی تر ئەویش وتی دەستت خۆش بێ کە پارێزگاری لە ئاینی خوا دەکەیت، بەڵام هیچ پۆلێکم بەدەستەوە نیەوداوای لێبووردن دەکەم ..!!!!.

ئەو بانگخوازە وتی کەچی کچێکی ئیماندار و لەخواترس و خەمخۆری رێبازەکەی پێغەمبەری خۆشەویست، یەك ملوانکەی ئاڵتوونی پێدام و وتی: مامۆستا گیان ئەوەی شك ئەبەم لە ماڵی دنیا تەنها ئەم ملوانکەیە سەرفی بکەن بۆ خزمەتی رێبازەکەی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)، لێرەوە ئەوە هاتەوە بیرم کە کاتێ پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) چەندین جار بانگەوازی دەکرد بۆ یارمەتی ماڵی، لەو کاتانەدا

(هاوەڵە بەڕێزەکانی)ی پێشبرکێیان دەکرد کە کامیان زیاتر ئەهێنێت، پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب نیوەی سەروەتی، پێشەوا عوسمانیش نیوەی ماڵەکەی، ئەبوبەکری راستگۆش ئـــەوەی هەیـــەتی دەیهێنێتـــە بـــەردەم پێغەمبـــەری خۆشەویست(ﷺ)، پێغەمبـەری ئـازیزیش(ﷺ) دەفـەرموێت : ئەی ئەبوبەکر چیت بـەجێ هێشـتوە بـۆ مـاڵ و منداڵـەکانت؟ ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت (خوا و پێغەمبەری خوا).

سوێند بە گەورەیی خوا گەر پێغەمبەرم خۆشتربوێت لـە سەروەت و سامانەکەم دەبێ خۆم بە خاوەن پـارە نـەزانم و بـــەکاری بهێـــنم بـــۆ سەرخســـتنی پـــەیامی ئیســـلام و بڵاوکردنەوەی رەوشت و سوننەت و ئاکارەکانی، با پارەداریم بـەڵام گـەر غیرەتـی بەخشـینم نـەبێ دڵـم پـێ ی خـۆش نابێ!!!.

کەواتـە ئایا تـۆش لـەو پارەیـەی کـە بەدەسـتت هێنـاوە یاخود بە دەستەوەیە ناردووتە بۆ قیامـەتت؟ ئەگـەر هـاتوو بـە حـەرام کۆکرابێتـەوە، یـاخود بـە غـەش و درۆ و خیانـەت بەدەسـتت هێنـابێ، ئـەوە لـەو کەسـانە نیـت کـە لـە کـۆڕ و مەجلیســـی پێغەمبـــەردان، توخـــوا گـــەر پێغەمبەرەکـــەت

پرسیارت لێ بکات کەچیت کرد بە پارەکەت بۆ خزمەت کردنی ئاین؟ چەندت خەرج کرد بۆ بلاوکردنەوەی سونەتەکانم، چەندیش لە دوای خۆت بە جێ دەهێڵی گەر لەناکاو بمریت؟ ! ! گەر ئیمانداری تەنها نوێژ و رۆژ و جل و بەرگ بێ ئاسانە ! ! بەلام کەسانی خاوەن ئاین کەمن چونکە بەهۆی سامان و دارایی لە خشتە براون ... هاوەلان لە کاتی بەرەنگاربوونەوەیان لەگەڵ بێ باوەڕان دروشمێکیان بەرز دەکردەوە کە ئەویش دروشمی (دینك دمك دینك لحمك) واتا ئاینت خوێنتە ئاینت گۆشتتە، بۆیە بەم شێوەیە سەرکەوتن تۆمارکرا و ئاینی خوای گەورە بلاو بۆوەکە بۆ گرۆهی بەشەری ناردووە ! ! منیش چەندێ ئازارم چەشت کاتێ وەلامی ئەم دوو موسڵمانە پارەدارەم وەرگرت و گریان قورگمی داگرت و وتم سوپاس بۆخوای گەورە (کە محمد المصطفی لە ناومان نەبوو) !

کاتی ئەوە نەهاتووە خۆشەویستی ئەو پێغەمبەرە راست گۆیە رابگەیەنین و ماڵ و سەروەت و سامان بکەین بە قوربانی و خزمەتی موسڵمانان و ئاینی خودای پێ بکەین؟ کاتی ئەوە نەهاتەوە وەکو (مەسیحیەك یان جوولەکەیەك)

یاخود هەرکەسێکی تر کە ماڵی خۆیان لە پێناو فیکرە و ئاین و ڕێبازی خۆیان بگرە لە پێناو بڵاوکردنەوەی (فاحشە و بەدڕەوشتی) پارە خەرج دەکەن و لە هەمان کات شانازیشی پێوەدەکەن، ئێمەش گیانی بەرەنگاربوونەوەمان بۆ دروست بێت و لای کەم وەکو ئەوان خەمخۆر بین بۆ ئاینەکەمان، هەر ئەم هۆکارە بووە مایەی ڕووخاندنی (خەلافەتی ئیسلامیی)، کۆکردنەوەی سەروەت و سامان و خۆبە خاوەن زانین و وازهێنان لە جیهاد و تێکۆشان و سەرف کردنی هەوڵ و کۆشش بۆ ئاینی خوا، چی لە پارە دەکەی قسە بە پێغەمبەرەکەت بوترێ؟ جنێوی پێ بدرێت و سووکایەتی بە موقەددەساتی بکرێت، یاخود کاریکاتێری لەسەر دروست بکرێت، شوێن کەوتوانیشی لەو کاتانەدا موحتاج و بێ پارە بن؟ چی لە پارە دەکەیت گەنجێك دەیەوێت خێزان پێکبهێنێ و دڵی پێغەمبەر(ﷺ) خۆش بکات و ئوممەتی ئەو زیاد بکات و خۆ لە زینا و بەد ڕەوشتی بەدووربخات؟ بۆیە کاتێك کەسێ لە دەرگات دەدات و داوای یارمەتیت لێ دەکات بۆ کاری خێر و خزمەتی ئاینی خوا دەبێ دڵ خۆش بیت و سوپاسی بکەیت، بگرە لەم کارە گەورەتر ئەوەیە تۆی خاوەن پارە

خۆت خەمی ئاینی خۆت بخۆیت و خۆت بڕیاری بەخشینی پارە بدەیت و بگەڕێ ی بەدوای پڕۆژەی خزمەت کردنی پەیامەکەی پێغەمبەری خۆشەویست، ئازایەتی لەوەدایە کە خەمی ئەم ئاینە هەلگریت و خۆت بە خاوەنی بزانیت، گەر ناتوانی وتار و نووسینت هەبێ، خۆ دەکرێ وتار و CD و پەرتوك بلاوبکەیتەوە و هەولی دامەزراندنی گۆڤارێکی ئیسلامیی و دەزگای راگەیاندن بدەیت، ئەمە مانای ئەوەیە من پێغەمبەرم لە سەروەت و سامانم خۆشتر دەوێت، لە بیرت نەچێ ﴿يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ﴾الشعراء: ٨٩ ، واتا رۆژێ دادێ مالٌ و مندالٌ دادت نادات مەگەر دلێ نەبێ کە سەلامەت بێ لە خۆشەویستی مالی دنیا، بۆیە خوای گەورە لە فەرموودەیەکی قودسیدا بە حەزرەتی موسا دەفەرموێت ( لا يجتمع حبي و حب الدنيا في قلب واحد، ولا يجتمع حبي و حب المال في قلب واحد ..) لە دلێك خۆشەویستی خوا و مالٌ و دنیا کۆ نابێتەوە !! زۆر ئاساییە زۆر دەولەمەند بیت زۆر هەبوون بیت، بەلام هەموو کات ئەم پرسیارەی خوای گەورە ئاراستەی خۆت بکە، چیم

لە چی خۆشتر دەوێت؟ ماڵ و سامانەکەم یاخود خودا و پێغەمبەرەکەم؟.

﴿وتجارة تخشون كسادها﴾ واتە مامەڵە و بازرگانیەك كە ترسی تیاچوونی هەبێت لامان خۆشەویستتر بێت لە خوا و پێغەمبەر و ئاینی خوا، تەماشا بکەن کەسی بازرگان چەندە ماندووە بۆ بازرگانیەکەی وچەندە گەشت دەکات و ماڵ و منداڵەکەی بەجێ دەهێڵێت،و بەردەوامیش خەواڵووە و شەو نخونی دەکات؟ چەندەش ئارەقە هەڵدەڕێژێ لەگەڵ ئەوەشدا هەر کۆڵ نادات، چونکە کارەکەی لا خۆشەویستە، بەڵام وایا دەبێت ئەم خۆشەویستیە بگاتە ئەو ئاستەی ( فێڵ بکەم ، غەش بکەم ، خیانەت بکەم و ئاینی خۆمی لەسەر دابنێم....)؟ بۆیە دەبینی لە پێناوی قازانجێکی کەم کاڵاکەمان مەرجی راستی تێدا نیە، لەکاتی مامەڵەکردنم راستی دەشارمەوە و فرت وفێڵ دەکەم، یاخود وا بەشان و باڵی کاڵاکەمدا هەڵدەڵێم کەچی لەراستیەوەنزیك نیە!!!!.

بۆیە بازرگان و مامەڵەچیەکان توێژێکی گەورە و کاریگەرن لەسەر پێشکەوتنی کۆمەڵگا، گەر پێغەمبەرم خۆش دەوێت و شەیدای دیدار لیقاو ومەجلیسی ئەوم

ولەهـەمان کـاتیش خـۆم بەشـوێن کەوتـەی ئـەو دەزانم چـۆن پەنا ببەمە بەر غەش و خیانەت هەروەك خۆی دەفـەرموێت : ( من غشنا فلیس منا) هەرکەس غـەش بکـات لـە ئێمـە نیـە، باسی فەرموودەکە لەوەدایـە ( لـە ترسـی ئـەوەی کاڵاکانیـان بمێنێتەوە و نەفرۆشرێت) لەچـی دەترسـیت؟ لـە ڕزقێـك کـە دیاری کراوە بۆت ؟ ئـەی بـۆ لـەوە نەترسـم گـەر پێغەمبـەرم لەدەسـت بچـێ لـەو سـاتەدا خـاوەنی هـیچ نـیم ؟!!! ئـەم باسە، باسی خۆشەویسـتی راسـتەقینەیە لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوادا، بۆیــە حــەزرەت بانگهێشــتی تایبــەتی بازرگانــەکان دەکات بۆ پلەی بەرزی لای خۆی و دەیکات بە هاوەڵی خـۆی وەك دەفـەرموێت (التــاجر الامـین مـع الشــهداء و النـبین و الصدیقــین ....) بازرگـانی (راسـتگۆ) لەگـەڵ پێغەمبـەر و شەهیدان و راستگۆیانە، رۆژێك پێغەمبەری خوا(ﷺ) خـەریکی دەستنوێژگرتنە و هاوەڵانی پەلاماری ئاوی دەست نوێژەکەی دەدەن و لەگیانی خۆیـانی (ئەسـوون) ئـەویش دەفـەرموێت: ئەوە چی دەکـەن ؟ ئـەوانیش دەڵـێن ئـەی پێغەمبـەری خـوا (خۆمـان موبـارەك دەکـەین)، پێغەمبــەری خۆشەویسـتیش دەفەرمووێ: ( من اراد ان یحبه الله و رســوله فلیؤدی ألامانة

و ليصدق الحديث ولا يؤذي جاره )…. هەرکەس دەیەوێت خوا و پێغەمبەر خۆشیان بوێت ئەمانەت پارێز بێت، راست گۆبێت، و دراوسێکانی ئازارنەدات . چەندە دروشمی جوانن گەر بێتوو کاریان لەسەر بکەین و بیکەینە رەوشت و بەرنامەی ژیانمان ، گەر هاتوو هەریەك لە ئێمە لە ئاستی خۆی ئەوەی لەبەردەستیدایە لەولایشەو خێزان و ماڵ و منداڵ و دەسەڵات و کاروباری میللەت بە ئەمانەت بزانیّ و بیپاریزیّ، بێگومان دەبێت بە خۆشەویستی ئەو، چونکە گەورەترین خەسڵەتی پێغەمبەرە کە (الصادق الامين)ە، ئەوەی هاوەڵان کە لەگەڵ پێغەمبەردا بوون ئەمە دروشمیان بوو و ئەمەش ئاکاریان بووە، بەم گیانە توانیان ئیسلام سەربخەن و بەجوانی و رەوانی دینداری بکەن، تۆش ئاگات لیّ بیّ گەورەترین ئەمانەت ئەمانەتی ئاینە، ئەرکی سەر شانی هەموو موسڵمانێکە کە بیپارێزێت، سەیرکەن گەرکەسێك، کەسێکی خۆش ویست پیّ ی دەڵێت هەرچیت دەوێت لە پارە و ماڵ و خانوو و دایك و باوك، دەتدەمیّ و دەیکەم بە قوربانیت تەنها تۆ رازی بیت !!! بۆیە من دەڵێم گەر نەگەینە ئەو ئاستە لە خۆشەویستی لەگەڵ خۆشەویستی خوا

کە (محمد المصطفی) یە، ناگەینە ئاستی (خۆشەویست)ی بەرامبەر بەو پێغەمبەرە، چەندەها کەس هەیە ژیانی خۆی دەخاتە هەڵدێرەوە لە پێناو خۆشەویستەکەی، گەر من و تۆش تەنها بە وتن و بە قسەی سەرزارەکیی خۆشەویستیمان بۆئەوپێغەمبەرە ئازیز و بەڕێزە دەربڕین ئەوابێگومان لە دنیا و قیامەت سەرکەوتن بەدەست ناهێنین.

شەشەم : ﴿ومساكن ترضونها﴾ ...لاتان سەیر نەبێت خوای گەورە ئەم پرسیارەمان لێ دەکات کە خانووبەرەتان لە خوا خۆشتردەوێت ؟ لە پێغەمبەرتان خۆشتر دەوێت؟ کارو کاسبی یاخود بازرگانی بۆ دابین کردنی خانوو بەرەیە، بەلایەوە گرفت نییە بە چ شێوازێك خانوو دروست دەکات بە حەڵاڵ بێ یاخود بە حەرامی، ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە خانوەکەم خۆشتر دەوێت!!! لە گەشتێکم بۆ تورکیا چوومە شوێنێك لە ناو (ئەستەنبول) شوێنی بەرزو زۆر خۆش ودەیروانیە سەر دەریای مەرمەرە (دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئیسلامیی) تێدا بوو ، جگە لەوەش قوتابخانەیەکی ئیسلامیی گەورە هەبوو، بە هەزارەها مامۆستای لێ دەرچووە و لە زۆربەی وڵاتان بوونەتە وتاربێژ و

زانا، ئەم خانووە گەورەیە موڵکی پیاوێك بوو، دەڵێن ڕۆژێك خێزانەکەی دەهێنێ و پێ ی دەڵێت ئەم خانووەت بەلاوە جوان و خۆشە ؟ ئەویش دەڵێ : زۆرم خۆش دەوێت، دەڵێ: چی دەڵێیت لەم خانووە خۆشتر و گەورەترو بەرزترت بۆ بکـــرم ؟ ئەویش دەڵێ جا لەوە باشتر هەیە؟ پیاوەکەی دەڵێ :دەی با ئەو خانووەمان بکەین بە وەقفێك بۆ خزمەتی ئاینی خوای گەورە، ئەویش یەکسەر ڕازی دەبێت، ئەو شەوە خەو بە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەبینێ لەگەڵ خۆی لە ناو حەوشەی خانووەکەی پیاسە دەکەن و دەستی لە ناودەستی پێغەمبەرە و ڕێزێك خانووش دروست کراوە، بۆ بەیانی بڕیار دەدات ئەو ریزە خانووە دروست بکات و تا ئەمڕۆش بۆتە مینبەرێك بۆ پتەوکردنەوەی شەرع و بەرنامەی خوا و دوای ماوەیەك وەفات دەکەن و دەچنە بەر ڕەحمەتی خودای کردگار، ئەمە واتای خۆشەویستیە بۆ خوا و پێغەمبەری خۆشەویست. باسەکە لەوەدایە ئێمە لە نێوان بەراورد کردنێ بۆ تەعبیر دەربڕین بە کردار و ڕەفتار بۆ خۆشەویستی، بە خۆشەویستی من دەگەم بە لوتکەی ئاسوودەیی و بە

خۆشەویستی لە واتای ژیان و ژین دەگەم، دینداری و، ئینتیما و شوێن کەوتن بە خۆشەویستی دەبێ ! !

* مەرجی باوەڕی تەواو و پتەو و کامڵ خۆشویستنی پێغەمبەرە، هەروەك خۆی دەفەرمووێت ( لایؤمن احدکم حتی اکون احب الیه من نفسه و ماله وولده ) فەرمودەکە زۆر روونە کە باوەڕدار کاتێ ئیمانداره پێغەمبەری خوای لە خۆی و ماڵ و منالّی خۆشتر بوێت ! ! ! چونکە بە خۆشەویستی ئەو، خۆی و ماڵ و منالّی پارێزراو دەبن، لەگەلّی دەبن لە دنیا و لە قیامەت، بە خۆشەویستی ئەوو بە هاوەڵێتی ئەو ژیانم خۆش دەبێ و مافی منالّەکانم دەدەم بە پەروەردە و رەوشت و ئادابێکی جوان گۆش وگەورەیان دەکەم.

* چ شتێك و چ کەسێك، دەبێتە مایەی تێك چوونی خۆشەویستی نێوان من و پێغەمبەرم کە پێویستە خۆمی لێ لابدەم ! ! !

پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) دەفەرموێت ( لایؤمن احدکم حتی یکون هواه تبعا لما جئت به) متفق علیه.

گەورەترین کۆسپ و لەمپەر لە بەردەممان بۆ گەیشتن بە خۆشەویستی ( حەز و ئارەزووەکانە )، (بۆیە دەفەرموێت :

باوەڕتان تەواو نیە تا ئارەزوەکانتـان لـە پـاش فەرمانـەکانی منەوە نەبێت) واتا من حەزدەکەم پـارە داریم، دەوڵەمەنـد بم پایە داریم ناوداریم، ئەم حەزانەم بەدی دەهێنم بەڵام بەپێ ی فەرمایشتەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ئاخۆ پێغەمبەرەکەم بەم کـارە رازی و رەزامەندە ؟ بەم مامەڵەیەشم رازیە ؟ حەزم لە جل و بەرگی تەنکە و روت بێت و لاشەم نمایش بکەم و جوانی خۆم دەرخـــەم، یـــاخود لـــە دوای خواســـت و ویســـتی پێغەمبەرەوەیـە(ﷺ)؟ وەڵامەکـە بۆخـۆت بـەجێ دەهـێلم خوشکی بەڕێزم !!!!.......

## نموونەی هاوەڵان

پێشەوا ئەبوبەکری راستگۆ ڕەزای خـودای لێبێـت هـەموو کات دەیفەرموو (بأبي و امي انت يارسـول الله) دایـك و بـاوکم فیدات بێ ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەبوبەکر سـەلماندی لـە ژیانیدا کە دلسـۆزی پێغەمبـەرە و زۆری خـۆش دەوێـت هـەر لەبەر ئەمەش بوو خوای گەورە فـەرمانی بـە پێغەمبەرەکـەی کرد کە عائیشەی دایکی ئیمانداران بکات بە هاوسـەری خـۆی و، ئەبوبەکری راستگۆش بکات بـە خـەزوری خـۆی، تەنانـەت

ڕۆژێك دەبیستێ کە بێباوەڕ و بت پەرستەکان لە دەوری پێغەمبەر کۆبوونەتەوە و خەریکن ئەزیەت و ئازاری دەدەن، ئەویش دەگاتە ناویان و دەیکات بە شەڕ لەگەڵیان و پێغەمبەر ڕزگار دەکات و خۆشی لەبەر لێدانی زۆریەئێش و سەخت لە هۆش خۆی دەچێت، تەنانەت دەڵێن لە دوای چەند ڕۆژێك دێتەوە هۆش خۆی و دەم و چاوی وا ئاوسابوو کە ناسینەوەی ئەستەم بووە! هەرکە دێتەوە هۆش خۆی یەکەم وشەی (این رسول الله)یە !؟ کوا پێغەمبەر ؟ دەڵێن لە مزگەوتە و سەلامەتەو جاریێ ئارامت هەبێت چونکە ناتوانی بچیت بۆلای، ئەویش دەڵێ تا بەچاوی خۆم نەیبینم دڵم ئاسودە نابێت، دوو کەس ئەم لاو ئەولای دەگرن و بۆلای خۆشەویستی دەهێنن و دەیبینێ لە خۆشیان دەگری و دەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا تۆسەلامەتی؟ قوربانی هیمەتی بەرزت بم ئەی ئەبوبەکری خۆشەویست کە خۆت کردبە قوربانی خۆشەویستی خۆشەویستان، هەر لەبەر ئەو هۆیەش بوو پێغەمبەر کردی بە هاوەڵی خۆی لە کاتی کۆچ کردن بۆ مەدینە و ناوی بە (صاحب) لە قورئانی پیرۆز تۆمارکراوە، کە کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) دەچێتەلای ئەبوبەکر دەفەرموێت:

هاوەڵی ڕێ ی، ئەویش یەکسەر دەگری، بەڵام گریانی خۆشی کە ئەم ڕێگایە دوورە پڕ لە مەترسیە لەگەڵ پێغەمبەری خۆشەویست دەبڕێت، بۆیە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) دەفەرموێت: گەر خوای گەورە ڕێگای پێم دابایە (ئەبوبەکر)م، دەکرد بە ( خلیل )ی خۆم، (ئەبوبەکر)ێك، ژیان و گیان و منداڵ و پارە و ڕۆح بخاتە سەردەستەکانی و پارێزگاری لە پێغەمبەر بکات و خۆی بکات بە قوربانی، چۆن ناگاتە ئەو ئاستە کە دەفەرموێت یەکەم کەس لەگەڵم بێتە بەهەشت ئەبوبەکرە!!!! کەواتە دەبێت ئێمەش هەموو خۆشەویستیەکمان بۆ ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە بێت و بە ماڵ و سامان و گیان و ڕۆح بە فیدای بین .

ئەوەتا پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت (یارسول الله) تۆم لە خۆم و ماڵ و منداڵ خۆشتر دەوێت دەفەرموێت ئێستا باوەڕت تەواوە ئەی عومەر ، تا دەگاتە ئەو ئاستەی خۆی دەکات بە خەزوری و (حفصە)ی کچی کردە خێزانی پێغەمبەر(ﷺ)، کە (عبدالله)ی کوڕی پرسیاری لێ دەکات ئەلێ ئەو کاتەی پێغەمبەر پرسیاری لێ کردی منت لە خۆت خۆشتر دەوێت و تۆش وەڵامت نەدایەوە تا چەند

هەنگاوێك لە پێغەمبەر دوور كەوتیەوە وتت: ئەی نێردراوی خوا، تۆم لە خۆم خۆشتر دەوێت، پێشەوا عومەر فەرمووی: ویستم راست گۆیم بۆ وەڵامەكەم بیرم كردەوە كێ منی هیدایەت دا و بوویە مایەی خێر بۆمن؟ ئەی كێ شەفاعەتم بۆ دەكات بۆیە دەبێ لە خۆمم خۆشتر بوێت، گەر كەسێك نێردراوی پەروەردگار بێت چۆن خۆشم نەوێت؟.

رۆژێك چەند خوشكێك كە باڵا پۆش نەبوون بۆ كێشەیەك هاتنە لام، دوای گفتوگۆكردن هاتمە سەرباسی ئەوە بۆ باڵاپۆش نین، هەریەك بە وەڵامێك كە خۆشیان بەو وەڵامانە قەناعەت و متمانەیان نەبووهۆكارەكەیان خستەڕوو، منیش هەریەكەو كاغەزەكێكی سپیم دابە دەستیان لەسەر ڕووی كاغەزەكە یەك ڕێزم نووسی بەم دەستەواژەیە (بەناوی خوای گەورە، لە موحەمەدی نێردراوی خوا) بۆ فلان... من پێغەمبەری خوام خوای گەورە پێ ی راگەیاندم كە دەبێ ئافرەتانی شوێن كەوتەی من پۆشتە بن ئایا بە قسەم دەكەن؟)، كاغەزەكەیان لا مایەوە وتم: خۆتان هەمان كاغەز پڕبكەنەوەو وەڵامی من مەدەنەوە بەڵام وەڵامی پێغەمبەری خوا بدەنەوە !!! چی بۆ دەنووسیت؟ ئایا دەڵێیت

(سمعنا و اطعنا) یاخود(سمعنا و عصینا)، چ دەستێك جورئەت بەخۆی دەدات کە قسەی خۆشەویستەکەی بشکێنیٚ؟ چ دڵێك ڕێگە دەدات پێغەمبەری خودا ڕووشکێن بکات؟ سوپاس بۆ خوا خۆیان پۆشتە کرد و نامەیەکی جوانیان نووسی و لایان ماوە کە تیایدا هاتووە: من ئەو کچە بووم کە چەندەها ساڵە خۆم بە ئوممەتی تۆ دەزانی، بەڵام بە قسەم نەدەکردی و خۆم پۆشتە نەدەکرد، پەیمان بیٚ تاوەکو دەگەمە تۆ ئەی نێردراوی خوا بە قسەی خوای گەورە و تۆی پێغەمبەر بکەم و سەرپێچی لە فەرمانەکانتان نەکەم..

گەر بێتو ئاوڕێك لە سەردەمی هاوەڵان بدەینەوە کە چۆن وەکو پەروانە لە دەوری پێغەمبەر کۆبوونەتەوە وهەریەك بە ڕۆڵی خۆی بە دەنگ و ڕەنگی خۆی بە تواناو بەهرەی خۆی وبە ئارەقی ناوچاوانی خۆی وبە خوێنی خۆی و بە پارە و ماڵی خۆی، خۆیان دەکردبە قوربانی پێغەمبەری خوا و ڕێبازەکەی؟، ئەمەیە نیشانەوهەقیقەتی خۆشویستن، ماڵ و حاڵیٚ دڵ و گیانیٚ نەکریٚ بە قوربانی ئاینی، ئەوا قوربانی دنیا دەبیٚ، هاوەڵی وا هەبووە بە دیلی لای ڕۆمەکان



گیراوە و لەخاچیان داوە و کردوویانە بە نیشانەی تیرەکانیان و تیرتیر لە ڕان و باڵیان دەدا و خوێن بە باڵای ئەچۆڕا لێیان دەپرسی رازی دەبیت تۆ لەم شوێنەبیت و لەبەرامبەردا موحەممەد لەماڵی خۆیدا بێ؟ وەکو شێر وەڵامی دەدانەوە: نە بەخوا ڕازی نابم من لەناو ماڵ و منداڵی خۆمدا بم و پێغەمبەر(ﷺ) درکێك بچێتە قاچیدا!!.

بۆیە یەکێکی وەکو ئەبوسوفیان و بگرە چەندەها کەسی تر لەم ڕۆژگارەش بە راشکاوانە دەڵێن : کەسمان نەدیوە کەسی تری خۆشبووێت وەکو هاوەڵان و شوێن کەوتوانی موحەممەد، کە موحەممەدی نێردراوی خودایان بەو شێوەیە خۆشویستبێت.

* تۆ براو خوشکی پێغەمبەری (ﷺ)، ئەوەتارۆژێکیان خۆشەویست دەچێتە گۆڕستانی بەقیع کە دووڕۆژ پێش لەدنیا دەرچوونیەتی، سەلامیان لێ دەکات ودوایی دەفەرمووێت: خۆزگە براکانم دەبینی، هاوەڵانیش دەڵێن ئەی نێردراوی خوا ئەی ئێمە برای تۆنین ؟ دەفەرمووێت : ئێوە هاوەڵی منن، براکانم ئەوانەن کە دوای من دێن و منیان نەدیوە و باوەڕیان پێ هێناوم، سوێند بەخوا ئەجری



یـەکێکیان هێنـدەی دە شـەهیدی هاوەڵـەکانم وایـە چـونکە ئەوان لەکاتی فەساددا دەست بە سوننەتی منـەوە دەگـرن و دەسبەرداری نابن)..

کەواتە پێت خۆشە بـە دیـداری ئـەو خۆشەویسـتە شـاد بیت؟ پێت خۆشە بە دەستی موبارەکی ئـەو ئـاوی کەوسـەر بخۆیتەوە؟ پێت خۆشە لە کۆڕ و مەجلیسـی ئـەودابیت و لـە فـیردەوس بەیەکـەوە لـە (منـابر) ی پـڕ لـە نـور و ڕۆشـنایی دابنیشـن و دیـداری یـەکتر بکـەن؟ کەواتـە تـۆش ئـەم چـەند ئامۆژگاریەی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) پەیڕەو بکە:-

یەکەم : ڕەوشت بەرزبە بەرامبەر بە خوا و لەگـەڵ خـەڵك واتە : وەفادار، حـەیا و شـەرم ، نەشـکاندنی فـەرمانی خـوا، بەدەمەوە چوونی بڕیارەکان .

ڕێزگرتنــی خــەڵکان : ڕێزیــان بگــرە، خیانــەت و درۆ و غەشیان لەگەڵدا مەکە، زوڵم و ستەم و بوختـان هەڵمەبەسـتە و ئازاریان مەدە، خۆشەویست و ڕێزداربە لەگەڵیان، و نەرم و نیان بە لە کار و کرداردا.

پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) دەفەرموێت: (إن إحبكم الى و أقربكم منى مجلسا يوم القيامة أكثركم علي صلاة و أحاسنكم اخلاقا) متفق عليه.

واتە: (خۆشەویستترین کەس لای من و نزیکترین کەستان لە کۆڕ و مەجلیسی من ئەوکەسانەتانن کە سەڵاواتی زۆرم بۆدەنێرن و، ئەو کەسانەیشی کە رەوشت بەرزن).

چەندە جوانە ئەم دوو مەرجە، مەجلیسێ نێردراوو خۆشەویستی خودا بیگێڕێ، ناکرێ کەسی بێ باوەڕو رەوشت خراپی تیادابێ چونکە ئەو مەجلیسە رازاوەتەوە بە رەوشتی جوان و ئاکاری بەرزوبڵند و جوان، ناکرێ درۆزن و غەشاش و داوێن پیس و جنێو فرۆش و شەڕانگێز و خیانەتکارو...هتد، لە مەجلیسەکەدا بن.

نموونە :

ئەگەر کەسێ بۆ داوای خوشکت یاخود کچەکەت بێت، ئەو کەسە لە رووی سومعە و رەوشتەوە نا پەسەندبێت و ناوی باش نەبێت، تۆ ناڵێیت ئێمە و ئەو کەسە لەیەك دوورین ؟ تۆ ڕازی نابیت بە خزمایەتی کەسێ کە رەوشت لەکەدارە و لەگەڵ تۆ ناگونجێ، بەهەمان شێوەش ناکرێ مەجلیسی

(رسول الله) (ﷺ) کەسی ڕەوشت نزمی تێدابێت، ئەگەر کەسێ خۆی ئارایشت بکات بەڕەوشتی بەرز و جوان پێش ئەوەی بگاتە خزمەتی پێشەواکەی ئەوا دنیای خۆی و دەورووبەری دەکات بەیەك پارچە بەهەشت، پێغەمبەرێك کە خوا بە ﴿وانك لعلى خلق عظيم﴾ وەسفی بکات، پێ ی خۆشە شوێن کەوتوانی بە هەمان شێوە بن، شوێنکەوتوانی دەبێ خاوەن ئاکاری جوان بن بۆ بەدەست هێنانی وەسفی جوان لەلای خودای تاك و تەنها و جوان و پاك و بێگەرد ! ! ! !

دووەم : سەڵاوات لێدان لەسەر پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)، ئەمە بکرێ بە ویردێك، بەردەوام و ڕۆژانە لای کەم ٢٠ جار سەلاواتی بۆ بنێرین، چونکە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) دەفەرموێت هەرکەس بەیانیان ١٠ سەلاوات و ئێواران ١٠ سەلاوات لەسەر من بدات ئەوە شەفاعەتی بۆ دەکەم، دڵەکان زۆر ئاسوودە دەبن بە سەلاواتدان غەمەکان کۆچ دەکەن.. ژیان تامێکی تر وەردەگرێ و گرفتەکان چارەسەر دەبن.

سێیەم : یادکردنی، واتە گەر کەسێك کەسێکی خۆش بووێت ئەوە زۆر یادی دەکات و لە بیری دەبێت،

بۆپێغەمبەریش بەهەمان شێوە هەموو کات چاوی لەوەیە رۆژێک بە دیداری بگات و رۆژێ لەسەر حەوزی کەوسەر بەیەکتر بگەن، بایادی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺبکەم بە هەڵسوکەوتو مامەڵەو عیبادەت و جوڵەی رۆژانەم لە هەرشوێنێك بم ..

چوارەم: گوێ رایەڵی کردن ﴿وَأَطِيعُواْ اللَّهَ وَالرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾آل عمران١٣٢.

نیشانەیەکی تری خۆشەویستی، گوێ رایەڵی پێغەمبەرە(ﷺ). بە قسە کردنی و هەوڵ دان بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە(ﷺ).

پێنجەم: رێزگرتن: ئەم خاڵە گرنگە، رێزی پێغەمبەری خوا(ﷺ) رێزگرتنە لە سوننەتەکانی و لە رێبازەکەی و لە ناوی و لەکەسایەتی لە خێزانی ولە بنەماڵەکەی .

شەشەم: سەرخستنی، کاتێ لە غەزاکان کە رووبەرووی بێ باوەڕ و خوانەناسەکان دەبووەوە دەیفەرموو (من یدفعهم عنی فله الجنة) کێ ئەمانەم لێ دوور دەخاتەوە شوێن و مەنزڵی بەهەشتە، هاوەڵان هەموو بە یەك دەست هەوڵی سەرخستنی ئاینی خوایان دەدا تا ئەوپەڕی سەرکەوتنیان بە

دەست هێنا و ئاینیان گەیاندە زۆربەی جیهان بە کەم توانایی یەکەیان، بەکەم نەفەری بە کەرەستەی لەرادەبەدەر کەم، (ئەبودوجانە) لەیەکێ لە جەنگەکان شەهید دەبێت هاوەڵان دەڵێن پشتی خۆی کردبوو بە قەلغان بۆ پێغەمبەرەکەی نەوەك تیر و رمێك بەر ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە بکەوێت، دەگێڕنەوە کە زیاتر لە حەفتا رم و تیر بە پشتیەوە بووە، سەرجەم هاوەڵەکانی تریش هەریەك بەشێوەیەك روح و گیانیان کرد بەفیدای پێغەمبەری خوا(ﷺ) ، گەر بپرسی ئەی من چیبکەم خۆ پێغەمبەر (ﷺ) نەماوە: ئەوامن لەلای خۆمەوە پێت دەڵێم ئەمانە بکە:

١. لە ناخی خۆتەوە سەرکەوە بەسەر ئارەزووە خراپەکان، کە ئەمەیان سەرکەوتنە بۆ پێغەمبەرەکەت.

٢. لەگەڵ دایك و باوك و خێزانت باش بە سەرکەوتنە.

٣. مامەڵەی جوان لەگەڵ دەوروبەرت ئەنجام بدە سەرکەوتنە.

٤. جێبەجێ کردنی سوننەتەکان و بەجێ گەیاندنی فەرزەکان سەرکەوتنە.

٥. بە هەموو توانایەك ئاینی خوا بڵاو بکەیتەوە سەرکەوتنە.

٦. خۆ پاراستن لە گوناه و تاوان و حەرام سەرکەوتنە.

٧. پەروەردەی جوانی منداڵەکانت سەرکەوتنە.

٨. ئەمانەت پارێزی و خیانەت نەکردن و غەش نەکردن و درۆ نەکردن سەرکەوتنە.

٩. شیعر نووسین و کتێب بڵاوکراوکردنەوە و بابەتی بڵاوکراوەی دەنگ و رەنگ ئیسلامیی سەرکەوتنە.

١٠.١٠- ماڵی دنیا کە خوا پێ ی داوی، لە پێناو سەرکەوتنی ئاینی خوا سەرفی بکەیت سەرکەوتنە.

دەرگاکانی سەرکەوتن زۆرە، بەڵام هیممەتی دەوێ، غیرەتی دەوێ، عیززەتی دەوێ، لێبڕان و شەونخوونی زۆری دەوێ، با دروشمی ژیانت ( نەسرەوتن تا سەرکەوتن ) بێت بۆ ئەم ئیسلامە شیرینە، گەورەترین سەرکەوتن گەیشتنە بە دیداری خوا و پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) ، جگە لەم دوو خۆشەویستییە هیچ خۆشەویستیەکی تری کاتی دنیا دادت نادەن و سوود و قازانجت پێناگەینن.

* دڵت خۆش بێ ئەگەر پێغەمبەرت لە دوای ئەو باسە خۆشویست، چونکە خۆی دەفەرموێت (المرء يحشر مع من احب) هەرکەس حەشر دەکرێ لەگەڵ خۆشەویستانی، بەومانایەی لەم دنیایەداچ کەسێکت خۆشویستوە ئەوا لەو دنیادا لەگەڵ ئەودا حەشر دەکرێیت، پیرۆزت بێ هاوەڵێتی پێغەمبەر لە دنیاو لەقیامەت... پیرۆزت بێ کە تۆ هەڵگری ئاڵاکەی ئەویت ... پیرۆزت بێ خۆشەویستی خۆشەویستان... سەرداری هەموو پێغەمبەران ... سەلامی خودای لەسەربێت لەورۆژەی هاتە دنیا ... سەلامی خودای لێبێت لەورۆژەی بوو بە پێغەمبەر ... سەلامی خودای لەسەربێت کە هەموو جیهانی لەتاریکی رزگار کرد و بووبەرێنمایی بۆ خەڵکان بەبێ جیاوازی ... سەلامی خودای لێبێت لەو رۆژەی وەفاتی فەرموو و گەیشت بە مەلەئی ئەعلا ... سەلامی خودای لێبێت لەورۆژەی لەگۆڕە پڕ نورەکەی دێتە دەرەوە ... سەلامی خودای لێبێت لەورۆژەی دەبێت بە شەفیع و تکاکاری ئوممەتەکەی ... سەلامی خودای لێبێت لەورۆژەی چاوو دیدەمان بەرووخساری ئەو شاددەبێت و قومێك لەئاوی کەوسەر بەدەستە پیرۆزەکانی

نۆش دەکەین ... هەزاران سەلاّت و سەلامی خوای گەورەی لەسەربێت ... ﴿.. والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته ..﴾

ئێوەش لە دوعا خێر بێ بەشمان مەکەن

حاجی کاروان

هەرێمی کوردستانی عێراق / هەولێر

www.bextewery.com

info@bextewery.com

٢٠٠٩/٧/١

# سوپاس و پێزانین

سوپاس بۆهەموو ئەوانەی هاریکارییان کردین لە نووسینەوەو کۆکردنەوەو بە چاپ گەیاندنی ئەم نامیلکەیە.. سوپاسی تایبەت بۆ برای بەڕێز نوسەر و رۆژنامەنووس (صهیب جمیل علی)، کە ئەرکی ئامادەکردن و پێداچوونەوەی کتێبەکەی گرتە ئەستۆی خۆی.. هەروەها سوپاس بۆ (سەرکەوت عەزیز عمر) کە هاوکاری کردم لە رێکخستنی کاری ئەم نامیلکەیە، سوپاس بۆ (هۆگر خدر نانەکەلی) کە تایپی نامیلکەکەی کرد.. خوای گەورە نمونەیان زۆربکات و بەر پاداشتی بەخێری خودای میهرەبان بکەون ..

# محمد ﷺ خۆشم دەوێت

تۆی بەندە گەر دەتەوێت پلە و پایەی خۆت لە لای پێغەمبەرەکەت بزانی ئەوە بپرسە ئاخۆ پلە و پایەی پێغەمبەر ﷺ لەلای تۆ چەندە؟
لەم رۆژگاری زاڵ بوونی خۆشەویستی دنیا و بازرگانی و ماڵ و منداڵ بەسەر دڵ و دەروونی مرۆڤدا، چۆن وا بکەین خۆشەویستی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەینە شورایەکی پۆڵایین بۆ پاراستنمان لە دنیاپەرستی و تەمەن بە فیڕۆچوون و بەهەدەرچوونی سەرمایەی ژیانمان؟




0-7518-0000-7
9 780751 800005

چاپ و دیزاین
ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا